# "پارێزەری دادپەروەری"

# شێخی نابینا دەکوژێت ؟

د. مصطفى بەدری

"لەوانەیە ئەمەیان دوا پەیوەندی نێوانم من وئێوە بێت - دەرمانیان لێ قەدەغە کردووم"

ئەمە دوا قسەی شێخی بینا بوو؛ شیخ عمر عبد الرحمن، بۆ خێزانی لە نێو زیندانەکانی ئەمریکاوە.

بەسەرهاتەکە ..

ئەوەیە کە خاکی میسرٍ وەخت بوو لە دەست زانایەکی ئەزهەری شەریف بتەقێ، چونکە کەسێکی حەق بێژ بوو ولە کاری خوادا ترسی لە کەس نەبوو، بۆیە کە بە دوایەوە بوون بە ترسەوە لەو خاکە چووە دەر، ولە سەرەتای نەوەتەکان دا ڕێرِەوەکەی گەیشتە لای "پارێزەری دادپەروەری" لە دنیادا.

تەقینەوەی تەلاری بازرگانی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٣ دا ڕوویدا، ویەنجەی تۆمەت بەرەو شێخی نابینا درێژ کران‌و، پاش دەستگیر کردن ولێکۆڵینەوە لەگەڵیدا هیچ بەڵگەی تۆمەتێکی لەسەر ساغ نەبۆوە، بەڵام سەرەڕای ئەوە ڕاپێچی دادگا کرا ؟

کە دادگاش نەیتوانی هیچ تۆمەتێك بەرامبەر بەو پیاوە بسەلمێنێ، کە لە ٥٥ـەمین ساڵی تەمەنیدا بوو، وتیان: کەواتە گریمانەکان بخەینە کار.

ئەو گریمانانە چی بوون کە بۆ ئیدانەکردنی شێخ پشتیان پێوە بەسرا ؟

وتیان: ئەو پیاوە یەکێك لە سەرسەخترین بەرهەڵست ونەیارانی عبد الناصر وسادات وموبارەك بوو لە وڵاتی خۆی دا کە میسرە، ونامەی دکتۆرای تایبەت بە خۆی لە ژێر ناونیشانی [مَوقِفُ القُرآن مِن خُصومِهِ كَما تُصَوِّرُهُ سورَةُ التَّوبة - هەڵوێستی قورئان لە نەیارانی وەك سوورەتی تەوبە نیگارگیری دەکات] نووسیبوو، کە سوورەتی تەوبەش هانی موسوڵمانان دەدات غەیرە موسوڵمانان بکوژن، کەواتە شێخ لەم ڕووداوەدا تۆمەتبارە، لەگەڵ ئەوەی کە لە کاتی ڕوودانیدا بە ئاشکرا ئیدانەی کردبوو، تا ئەوەی کە پارێزەرەکەی گوتی: ئەوان قورئان لە کەسی دکتۆر عومەر عبد الرحمن دا دادگایی دەکەن !

لەگەڵ ئەوەی کە نامەی دکتۆراکە شێخ بیست ساڵ بەر لەو ڕووداوە نووسیبووی‌و، بڕوانامەی "عالمیة"ی بە پلەی نایاب وخانەی ڕێزلێنانەوە پێ بەدەست هێنابوو، بەڵام دادگای "پارێزەری دادپەروەری" بە بەڵگەیەکی کافی زانی بۆ ئیدانەکردنی شێخ و٣٨٥ ساڵ حوکم کردنی، ئەو ژمارەیەی میدیاکان بە [زیندانی هەتا هەتایی] کورتی دەکەنەوە !

منیش هەر وەك ئێوە شێوازی دەستنیشان کردنی بەڵگەکان وژمارە ٣٨٥ەکەم پێ سەیر بوو، تا ئەو کاتەی گوێم لە دکتۆر عبداللە ی کوڕی شیخ عومەر عبد الرحمن بوو لە زاری پارێزەرەکەیوە دەیگێڕایەوە کە: ئەوان بە پێی یاسای [نیەت - نیاز]ەوە دادگایی شێخ

عومەریان کرد، کە یاسایەکە لە دەوڵەتی ئازادییەکان "پاریزەری دادپەروەری" دا هەیەو پتر لە ٢٠٠ ساڵە بەکار نەهێنراوە، ئیتر ئەم بەزمەی لێ کەوتەوە.

دەزگاکانی ئەمریکا "پاریزەری دادپەروەری" بەوەندە نەوەستان کە حوکمی هەتا هەتایان بەسەر شێخدا سەپاند، بەڵکو بڕیاریاندا بیخەنە زیندانی تاکەکەسییەوە "اِنفِرادي"، زیندانی انفرادی ؟ بەڵێ .. بەڵێ سەرەڕای ئەوەی کە لە دەست کۆمەڵێك نەخۆشییەوە دەیناڵاند، وەك سەرەتانی پەنکریاس ونەخۆشی شەکرەو ڕۆماتیزم وسەرئێشەی درێژخایەنو، نەخۆشی دڵ وفشار ونەتوانایی جووڵەکردن بێ لە کورسییەوە ؟ لە زیندانێکی تاکەکەسی بێ هاوڕێ دا، پەیوەندییە دەرەکییەکانی لێ بڕا بوون (کە خۆی پیاوێکی نابینایە) گەر کەوتە سەر زەوی ناتوانێ کارێك بۆ خۆی بکات ویارمەتییەکی خۆی بدا، تا ئەو کاتەی پاسەوانی زیندانەکە بە خێر وچاکەی خۆی دوای چەند سەعاتێك یارمەتییەکی بدات ؟

شێوازەکانی ئەشکەنجەی جەستەیی ودەروونی گەیشتنە ئەو ڕادەی کە بە سەعات لە سەرمادا بە تەواو ڕووتییەوە جێیان دەهێلا، سەرەڕای ئەوەی کە کامێراکان بەردەوام - تەنانەت لە کاتی سەرئاو وخۆ شۆردنیشدا - چاویان لەسەر بوو، وئەگەر ئەو قورئانەی نێو دڵی شێخ نەبا بێ گومان هەر لە دوای چەند ڕۆژێك لەو حاڵەتەوە کۆچی دوایی ئەکرد وگیانی لەدەست دەدا.

با وێنەکەتان بە ڕووداوێك کە بەسەر خۆمدا هاتووە بۆ نزیك کەمەوە، کاتێك کە ساڵی ٢٠٠٨ بۆ ماوەی نزیکەی ٨٠ ڕۆژ لە زیندانێکی تاکە کەسیدا کرام، گەنجێك بووم لە تەواوی تەندروستیمدا وهیچ یەك لەو نەخۆشییانەی شێخم نەبوو - ڕەحمەتی خوای لێبێ، تەنها دوای چەند ڕۆژێك لە هێشتنەوەم لەو زیندانەدا دەستم بە بینینی شتی سەیر وعەجیب کرد لە خەیاڵما وەك ئەوەی لە خانوویەکی هۆرەر وڕوعبدا بم، گەر یارمەتی وکۆمەکی

خوای پەرورەدگار نەبا لەگەڵ برە کاتێك کە پاسەوانەکە ڕێی دەدام لەگەڵ هاوڕێیانی زیندانەکەی تەنیشتم بەسەری بەرم، لەوانەیە تووشی شێتی بووایم.

سەرنج بدەن کە من باسی ماوەیەکتان بۆ دەکەم کە لە هەشتا ڕۆژ تێپەڕ نەبوو، بەڵام شیخ ٢٤ساڵی تەواوی بەم حاڵەتە بەرێکرد (نزیکەی ٩ هەزار شەو ورۆژ) .. !

بێ ئابڕوویی "پاریزەری دادپەروەری" گەیشتە ئەو رادەی کە تەواوی دەرمانەکانی زیندانەکەی شێخیان بەر لە حەفتەیەك لە وەفاتی دا گێڕایەوە، رێك وەك ئەو کەسەی دەزگای هەناسەکێشان لە نەخۆشی تەنگژەی دڵەوە دەگێرێتەوە لە ژووری چاودێری چرِدا، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی شەممە ٢٢ جمادی الأولی ١٤٣٨ - ١٨ شوباتی ٢٠١٧ لە نزیکەی تەمەنی ٨٠ ساڵیدا بە سەبر وئارامی وچاوەڕێی ئەجر وپاداشتی خواوە بە دیداری پەروەردگاری بگاتەوە، لە تاوانێکی کوشتنی بە ئەنقەستدا.

ئەم تاوانە تاوانی ترامپ ورژێمەکەی نییە - وەك هەندێك خەڵك پێیان وایە، بەڵکو تاوانێکە چوار رژێمی یەك لە دوای یەکی بەسەردا هاتوون، لە سەرەتای ماوەی کلینتۆنەوە دەستی پێکرد وپاشان جۆرج بۆشی دووەم ودواتر ئۆباما وفەسڵەکانی لە ماوەی ترامپ دا کۆتاییان پێ هات، کە بڕیاریدا شێخ لە دەرمان قەدەغە بکرێت، بۆ ئەوەی فەسڵەکانی ئەم شانۆگەرییە بگەنە کۆتایی،و ترامپ ئەوەمان بۆ دووپات کاتەوە کە شتێکی تازەی لە سیاسەتی ئەمریکادا پێ نییە.

هەموو ئەوەی کردی ئەوە بوو کە ئابڕووی بردن وکارە پەنهانەکانی نیشاندان، چونکە دەستدرێژی وتەعەدا کردن لە موسوڵمانان لە خودی سیستم ورژێمی ئەمریکیدا ڕەگی داکوتاوە، بەڵام لە ئاستی دەرکەوتنیدا لە سەرۆکێکەوە بۆ سەرۆکێکی دەگۆڕێت،و

لێدوانەکەی جۆرج بۆش مان لێوە دوور نییە کاتێك کە ئەوەی ڕاگەیاند شەڕەکە (شەڕێکی خاچ پەرستییانە)یە.

ئەم "پارێزەری دادپەروەری"ییەی زۆرێك لە ڕۆشنبیر ولاف وگزاف لێدەرانی پاراستنی ماف وئازادییەکان بە شان وباڵیدا هەڵدەدەن، هەر ئەوەیە کە ڕایگەیاند زیاتر لە ٢٥ هەزار مووشەکی بەسەر سەری موسوڵمانان لە سووریا وعێراق وئەفغانستان وپاکستان ویەمەن وسۆمالدا خستۆتە خوار (نەك لە تەواوی مێژوویدا) بەڵکو تەنها لە یەك ساڵدا ٢٠١٥، هەر ئەویشە کە عێراقی بە بیانووی ڕزگارکردنی گەلی عێراقی لە سەدام حوسێنی دیکتاتۆرەوە داگیر کرد، پاشان تەسلیم بە ئێران ومیلیشیاکانی حەشدی شەعبی (شیعەی تایەفەگەری) کرد؛ کە قێزەونترین تاوان دەرحەق بە موسوڵمانان لە بەرچاو وگوێی تەواوی جیهاندا ئەنجام دەدەن وبە کۆمەك وپاڵپشتی هێزەکانییەوە کە تا ئێستا لە ناوچەکەدا بەربڵاون.

جا گەر بڵێین بەم زوانە بێت ئەفسانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داڕووخێت، یا لە داهاتووی دووردا، ئەوا تاوانە بەردەوامەکانی دەرحەق بە موسوڵمانان بە بیانووی شەڕی تیرۆرەوە، کەفیلی کۆکردنەوەی تۆپەڵە بەفرێکی گەورەی گەنجی بە غیرەتن، کە لە هەوڵدایە نەخشەکە بگۆڕێت وتۆڵەی ئەو خوێنە حەرامانەی ئەمریکا ڕشتووینەتی بسەنێتەوە.

ئەو گەنجانە چیتر گوێ بەو سەرکردە وڕەمزانە نادەن کە دەستەواژەی وەك (توندوتیژی - تیرۆر) بە هەمان ئەو مەفهووم وتێگەیشتنەوە بە کاردەبەن کە ئەمریکا بەکاریان دێنێت، بۆ ئەوەی ڕێ لە مەزڵووم وستەمدیدان بگرن بە حەق ومافەکانی خۆیان بگەن‌و وەریانگرنەوە، بەڵام فەرمانبەرداری قەولی خوای پەروەردگاری حەق دەبن کە دەفەرموێت: {وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ | إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ

فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ۚ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} **- لە ڕاستیدا ئەو کەسەی دوای ستەم لێکردنییەوە حەقی خۆی دەسەنێتەوە، ئەوانە لێپرسراو نین - بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە [الشورى ٤١-٤٢].**

اللهم ارحم الشيخ عمر عبد الرحمن وارفع درجته في عليّين، واحشره مع النبيّين والصدّيقين والشّهداء والصالحين، وحسُنَ أولئك رفيقاً.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @Gizing_Net

١٤٣٨ - ٢٠١٧